


# پلان

## چیرۆکی منداڵانە

نووسینی: سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر

نیگار: گرفتار کاکەیی

# پلان

زنجیرەی کتێب: ( ٨٧ )
ناوی کتێب: پلان
نوسینی: سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر
دیزاین: شەمێران حەمید
پێدا چونەوە و هەڵەچن : زیاد حسین گەردی
تایپ: نووسەر
سەرپەرشتیاری چاپ: عەبدولقادر عەلی مەردان
ژمارەی سپاردن: ( ٧٩٥ )
تیراژ: ( ١٠٠٠ )
نرخی: ( ٥٠٠ ) دینار

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی زنجیرە کتێبی منداڵان




خاوەنی ئیمتیاز: وەزیری ڕۆشنبیری و لاوان
سەرنووسەر: نیان ئەحمەد



زنجیرە کتێبی منداڵان لەسەر ئەم سایتە بخوێنەوە:
www.kurdchap.com

# خۆشی خۆشاوی دەوێت

خۆشی، کیژۆڵەیەکی شارنشینە، خرپنەو تێر ئاقڵ و جوان رەفتارە. پایزێکی درەنگ لەگەڵ دایکی و برا بچووکەکەی چوونە ماڵی خاڵیان لە لادێ. دوای نیوەڕۆی رۆژی دواتر، خۆشی خان لەگەڵ پۆلێك منداڵی خزم و هاوتەمەنانیان، چوونە ناو باخەکانی بەرماڵان، هەناری قەڵشیوی دەنك سوور، بە لکی دارەکانەوە شۆڕ بووبوونەوە، باڵندەی خۆشئاواز دەیانچریکاند،





سمۆرەی وشتی کلك گڤە، بەسەر کەدی دارانەوە بە دوای یەکدا بازبازێنیان بوو...

کیژۆڵەکان، ژێر گەڵا وەریوەکانی نزیك قەدی دارگویزەکان گەڕان، هەر یەکەو کۆشێك گوێزیان دۆزییەوە...

شادانی کچەخاڵی خۆشی، بە خۆشییەوە گوتی: ئەمانە گوێزی سمۆرانن، لە پاییزدا کۆی
دەکەنەوە و هەڵیدەگرن، لەزستانی سارد و تووشدا دەیخۆن.
ئێوارەیش لە ماڵەوە، شەوچەرەیان مێوژ و کاکڵە گوێزو شەکرەباوی بوو.



دایەگەورەیان، سرکەی هەناری ترش و دۆشاوی تریێ رەش و ئاوی زوڵاڵی کانی بۆگرتنەوە و گوتی:

ئەمە خۆشاوی لادێییانە، سرکە و دۆشاومان لە پایزەوە سازکردووە، لە زستاندا دەیخۆینەوە، سەرو پەرداخیان خواردەوە، چێژی مزرێکی مەزەداربوو...

خۆشی و شادان هەر یەکەو پەرداخێکی دیکەیشیان نۆشی.

خۆشی گوتییە دایکی: دایە گیان! بچینەوە شاریش

من هەر خۆشاوی لادێییانەم دەوێت...



# کەڵەشێر کاتژمێرە

ماڵی نمەی جوانکیلە لە لاپەڕی دێیە، نمەخان، ئێواران زوو دەخەوێت و بەیانیانیش زوو لە ناو نووێن دەردەچێت. کات، کاتی هەڵاتنی تیشکی خۆر و هاتنی ڕۆژێکی نوێیە. نمە لە سەر سەکۆی تەك باخچەکەیانەوە، دەیروانییە دیمەنی پاشبارانی بەهاری و ئاسمانی شین. کەڵەبابێکی پەڕڕەنگینی پۆپیتە قیت، حەوت هەشت مریشکی بە دواوە بوو، بە دەنووك و ڕنە، چینەی لە خاشاکی تەڕ دەکرد، چەندین دەنکە گەنم و برنج و نیسك و ئارینۆکی دۆزییەوە، لای لە مریشکەکان کردەوە: دوق... دوق... وەرن دانەکە بخۆن.



مریشك بە راكردن گەیشتن، كەڵەبابی كەیفساز، بە پەڕ گیفكردنەوە، باڵی راستەی لە ران و لاقی راستی و لە زەوی خشاند، بە دغەدغ، بە دەوریاندا خولایەوە، ملی هەڵكێشا، بە بازێك چووە سەر كولانەكەیان، سەیری هەرچوار لای خۆی كرد، بە باڵ چەپڵەی كوتا، پۆپیتە سەری و شاپەڕی كلكی لەیەكدی نزیك كردنەوە، سنگی دەرپەڕاند، سێ جار لە سەر یەك بە دەنگی بەرز ((قوو ققوو قوو قوو...دغغ...))



به به‌خۆنازین و شکۆدارییه‌وه هاته‌وه لایان.

دوو باره که‌ڵه‌بابی ده‌نگ باریك، له‌ دووره‌وه به‌ بانگدان وه‌ڵامیان دایه‌وه.

که‌ڵه‌بابه‌که‌، په‌ڕه‌ ره‌نگین و بریسکه‌داره‌کانی سنگ و ملی گیف و هه‌ردوو باڵیشی کردبۆوه‌، به‌ دوقه‌ دوق ده‌سووڕا، نه‌ده‌سره‌وت، ناوه‌ ناوه‌ چینه‌ی ده‌کرد، ده‌نووکی له‌ زه‌وی ده‌دا، بانگی مریشکه‌کانی ده‌کرده‌وه‌، خورته‌ که‌ڵی و ئازایه‌تی خۆی ده‌نوواند.

نمه‌ چاوی به‌ که‌ڵه‌باب و مریشکه‌کانه‌وه‌بوو، به‌ره‌و دا پیره‌یشی هه‌نگاوی ده‌نا، پرسیی:

دایه‌ گه‌وره‌! بۆ ئه‌م که‌ڵه‌شێره‌ هێنده‌ بزێوه‌؟

بۆ هه‌ر ده‌قووقێنێ و کرنابێته‌وه‌؟

بۆ مریشکه‌کانیش وه‌ك ئه‌و بانگ نادەن؟...



دا پیره‌ی: کچه‌که‌م! که‌ گه‌وره‌ بوویت به‌بێ پرسین زۆر شت له‌ خۆته‌وه‌ ده‌زانیت

کاری مریشك هێلکه‌کردن و کڕکه‌وتن و جووجه‌ڵه‌ هه‌ڵێنان و گه‌وره‌کردنییانه‌.

له‌مه‌ لابدات سه‌ری خۆی ده‌خوات ، کابانی ماڵ سه‌ری ده‌بڕێت و گۆشته‌که‌ی ده‌خۆن.

ئەم کەڵەشێرەی دەیبینی، ئەمە کەڵی مریشك و باوك و باپیرەی جووجەڵانە، بە ڕۆژ، بە بانگدان، بانگی مریشکان دەکات شووی پێبکەن، ئەویش دانیان بۆ دەدۆزێتەوە و پاسەوانی خۆیان و جووجەڵەکانیان دەکات، بە بانگدان دوژمنەکانی دەتۆقێنێ، تێیان دەگەیەنێت کە ئەم ناوچەیە پاوانی خۆیەتی، هەر کەڵەبابێکی غەوارە بێتە پاوانەکەی ئەو، ئەوا لەگەڵییا دەجەنگێت و هەڵیدەبڕیت و لە ناوچەکە دەری دەکات.



هەر لە (دە) بارە کەڵەشێر نۆیانییان سەردەبڕن، بۆ هەر ٨ - ١٢ سەرەمری هێلکەکەر کەڵەشێرێك رادەگرن، کەڵەشێر هێلکە ناکات و ئالیکی زۆریش دەخوات.

کەڵەشێر بۆ ئێمەیش چاوناس و کاتژمێری شەوە، شەوانە لە یەك کاتدا: لە نیوە شەودا، لەکاتی پارشێوخواردندا، کاتی نوێژی بەیانی. لە کاتە دیارکراوەکانی شەودا، قووقە قووقی زەنگی کاتژمێرە.

ئەگەر ئەویش لە یاساو داب و نەریت دەربچێت، شەوانە سەر لە ئێوارە، یا لە کاتی نەگونجاودا بانگبدات، ئەوا دەترسن ئاژاوەو ڕەنجان و تۆران بۆ کابانی ماڵ و خێزانەکەیان پەیدا ببێت، بۆیە کەڵەشێرەکە سەردەبڕن و دەیخۆن.



# داركونكەرە

خۆر بە ئاسمانەوە وەك پرتەقاڵێكی نێو كەناری كانیاوێكی شین بوو.

( نمە خان ) دەستی یارۆ ی برای گرتبوو، بەیەكەوە چوونە ناو باخەكەیان. شنەیەكی فێنك و بۆنخۆش، شادو بەدەماخی كردن. لە نێو لك و چلی چرو پڕی داران، دەنگی باڵندان دەهات. پشیلەیەكی خڕپنەی رەشبەڵەكیان بینی كە خۆی لە نێو گژوگیادا مەڵاسدابوو. بە ئەسپایی، بە ماتە مات، دوو سێ هەنگاو دەچووە پێش و خۆی مات دەكردەوە.

نمە سەری هەڵێنا، بێچووە باڵندەیەك لە كونێكی قەدی دارچنارەكەی بەرامبەری بە دەمی بەشییەوە ویسە ویسی بوو.

لە پڕ، فرڕڕ... چك ! تك! باڵندەیەكی رەنگین و بزێو، سەری سوور و بەرسنگی زەرد، پشت زەردوسپی و خاڵخاڵ، دەندووك درێژو وشت و وشیار، لە تەك زاركی كونەكە نیشتەوە، نمە هاتەوە یادی،

دا پیرەی دەنگ و رەنگ و ئاوازو رەفتاری مەلانی دەناسی... پێی گوتبوو:-

(( ئەمەیان باڵندەی داركونكەرەیە، دەنووك رەق و كەللەشەقە، بەرۆژ ناسرەوێت، هەرخەریكی دەنووك وەشاندن و داركۆڵینە، بەشەویش لەبەر ئازاری سەر و دەندووكی ناخەوێت. )) باڵندەكە چاوی بەملاو بەولادا گێڕا... كوللەیەكی بۆری مردوو و زیكزیكەیەكی سەوز لەنێو دەنووكدا بوو... كوللەكەی خستە نێو دەمە دا پچڕاوەكەی نێو هێلانەكەوە. كوت كوت زیكزیكەكەی دەنووكی لەتوێكڵی دارەكە كوتا، كە بێجووڵەی كرد ئەویشی خستە نێو دەمەكەوە. بەبازدان و چڕنووك گیركردن و دەندووك وەشاندن بەدەوری قەدی دارەكەدا سووڕایەوە. باڵندەكە بە سركییەوە سێ باز سەركەوت، دوو باز بەلاری دابەزییەوە، كوت كوت... خێرا خێرا كەوتە كۆڵینی توێكڵی دارەكە، كرمێكی سپی و قەڵەوی دەركرد، هاتەوە بەردەمی كونەكە، سەر و مل و نیوەی سنگی بردە ژوورەوە، هەر جووجەڵە دەم بەشەكەی پێشتری بینییەوە، كرم بەدەندووكەوە سەری كێشایەوە، هەستی ڕاگرت. ڕاما... دووبارە سەری بەهێلانەكە داگرتەوە ... كچەكەی تێرو پڕو كرە، كوڕەكەیشی بزرو بێ سەروشوێنە. بەجریوە جریو:- بەر لە ئێستا كاروانێك خواردنم بۆیان هێنا، هەردووكییان دەمیان دا پچڕی، یەكەو مێرووم كردە دەنووكییانەوە. گۆرانییان چڕی.



دایکیان لەکوێیە؟ دایك و کوڕ چییان بەسەرهاتووە؟
بیری کەوتەوە کە من بۆ ڕاوە مێروو ڕۆیشتمەوە، دایکییان نێچیر بە دەندووکەوە دەگەڕایەوە! بەهەستەوە لای لەملاو لەولا کردەوە، نەختێك لەملاتر، لەژێر پیرە دارتووێکی پەلوپۆ بڵاو، باڵندەیەکی هاوشێوەی، بەجریوە جریوێکی ترسناك و بە فڕینێکی خێرا، بەرزبۆوەو بە پەلەتر دابەزییەوە.
دارکونکەری سەر دارچنارەکە، چریکاندی و بەرەو شوێنی نزم بوونەوەی فرندەکەی دیکە فڕی، بینی کورەکەیان کەوتووەو بە پێ ڕۆیشتووە، دایکی بەگریانەوە بەدەوریدا دەخولێتەوە، داوای فریاکەوتن و دەربازکردنی جووجەلە شەکەتەکەی دەکات.



ئەمە، هەردوو باڵندەی خەمگین و بێ دەسەڵاتی بینی، خەریکن ڕۆلەکەیان ببەنەوە نێو هێلانەکەیان.
بێچووەکەیان توانای فڕینی نەبوو، زراو ڕژاو دەگریا و دەپاڕایەوە جێینەهێلن، باوانی لەشەکەتییان وەستان.
دایکی شینی دابەست، باوکی بێچارەی بە ئومێد براوییەوە:ـ ((بۆ لاساری دەکەیت؟ ڕۆژانە ئەم تاریك و ئەو تاریك ئامۆژگاریتان دەکەین، تاکو باڵنەگرن لەهێلانە دەرنەکەون، کەچی تۆ هەر کەچکاری دەکەیت! مل بۆ ڕاستی کەچ ناکەیت... پێم ناڵێیت ئێستا چی بکەین؟))
باوکەی دڵ تووند بە نابەدڵییەوە هەڵفڕی، بەرزبۆوە، بیرو چاوی گێڕا، پشیلە خرپنەکەی بینی خۆی دانووساندووە، مگێزی لە بێچووەکەیان خۆشکردووە، خەریکە هێرش بکات،
بە فرتکەیەك دایکە دەگرێت و هەردووکیان لرف دەکات.
بۆیە بەتیژی دابەزی و چریکاندی و پەلاماری پشیلەکەی دا.
ویستی بە دەندووك چاوی بکۆڵێت، گرپە خرپنەش بە تووك گڤییەوە هەڵستایە سەر هەردوو پەلی دواوەی، کلکی لە شێوەی کوێرەمار جووڵاند، دەمی دا پچڕی، کەڵبەی دەرخستن، میاواندی، هەردوو چنگی قژکردنەوە و کردنییە مەتاڵی لووت و چاوی، لەولایشەوە جووجەڵەکە دەیزیڕاندو داوای ڕزگارکردنی دەکرد.
دایکیشی دەگریاو بە دەوری دا دەسووڕایەوە.



نمەو یارۆ، هەردووکیان بەدیاریانەوە مات و نیگەران حە پەسابوون.
کەبینییان دایکەکەش خۆی ئازا کردو گەیشتە هاریکاری پیاوەکەی، گەشانەوە.
دووباڵداری نێرو مێ، بەگوڕ، بێ ترس، لە پاش و لە پێش، بۆ کتکی جوجەڵەخۆر دەچوون.
خرپنە خەریك بوو ببەزێت، ڕابکات و سەری خۆی دەربازبکات، بەڵام چاوی لە گۆشتی ناسکۆڵەکە بەرنەدەبوو،
ویستی بە فرتکەیەك خۆی بگەینیتێو لەبای غارەوە بە قە پێك بیرفێنێت و لەژێر تووترکەکان بە کاوەخۆ بیخوات.
نمەخان زانی دایکە و باوکە بێچووی بێ باڵیان بۆناچێتەوە ناو هێلانەکەیانەوە، ئێستاش نەبێت پاش چەند
خوڵەکێکی دیکە، شەو دادێت و خرپنە لرفی دەکات. بۆیە بڕیاری دا
بەهانایانەوە بچێت، فریای بێچووەکە بکەوێت،
بەڵام بەمەرجێك کە ئیدی پەند وەربگرێت
لەمەودوا بە کەللە ڕەقی و سەرە ڕۆیی،
سەرپێچی لە قسەی باوانی نەکات.
لەو چرکەساتەی کە پشیلەکە نیازی بازدانی بوو،
نمە داربەدەست، هەڵی کوتایە سەری،
بە تووڕەیی و دەنگی بەرزەوە تێیڕاخوڕی: - ختتە! ختتە! کتکی درندە!
بێچووی ئەوان بخۆیت، بێچووی تۆش دەخورێتەوە



# (چاکە چین)

مامۆستا ڕاوێژیار، وانەی کۆمەڵایەتی پۆلی حەوتەمی دەگوتەوە. لە دەستپێکی وانەی یەکەمدا گوتی: -

کێ دەزانێت چاکترین و نایابترین؟... ناشیرینترین شت، جوانترین ڕەوشت و کردار بۆ مرۆڤ و دەورو بەرەکەی چین؟



پێرس: ماموٚستا! باشترین شت بوٚ مروڤ دایك و باوك و كەس و كاری چاك و هاورێی هێمن و ژیرو پاكن.
مروٚڤی جینگزو هاورێی بڵحیش، نا پەسندترین دەردو بەڵان بەروٚكمان دەگرن...



ماموٚستا: چی دیكەش؟
دیلان: دەوڵەمەندی و جوانی و رێكپوٚشی، بخوٚر خوٚشی زوٚر خوٚشن.
هەژاری و رووتی و برسیەتیش ئەستەنگن.
راوێژیار: ئافەرین بوٚ هەردووكتان.
چاوی پێداگێرانەوە... كێی دیكە؟
كاردوٚ: كەڵكداری و هاریكاری و تەبایی، دلوٚڤانی... رەوشتی فرە بەرزو نایابن
بەڵام پوٚخلی و هەناو رەشی و خوٚ پەرستی تابڵێی درێون.
ماموٚستا: ئافەرین... ئیتر...؟
شكوٚ: خاك، بژێو، ئوٚكسجین، ئاوی پاك ))ئاو و ئاوەدانی(( ئەگەر ئەوان نەبن، ژیان دەوەستێت.
ماموٚستا: ئافەرین... فەرموو ئاڵان!...
ئاڵان: ماموٚستا! خانوو و باخچەی خوٚش، ترومبێلی نوێ، رووناكی، ئەنتەرنێت، شتی چاكن، بەڵام تاریكی و كوژانەوەی كارەباو..
ماموٚستا: دەمخوٚش... فەرموو دابان!
دابان: بەهرەی چاك و تەندروستی بێ گرفت، هەنگوینن.
بەڵام نەخوٚشی و نەزانی و ناهێمنی، ژەهرن، دەردی سەرن.
ماموٚستا:- زوٚر چاكە! چیدیكەیش؟

یارۆ: ماموستا! باپیرەم دەڵێت منداڵی زۆر خۆشە، بەڵام نرخی نازانین تا لە دەستمان دەرنەچێت. مردنیش، لە پیری و نەخۆشی و بێسێبەری خۆشترە.

کامیار: - بە زەردەخەنەوە: ماموستا بێسێبەری لە هاویندا یان لە زستان؟

ماموستا: کاکە یارۆ! باپیرەت مەبەستی لە بێسێبەری چیبوو؟

یارۆ: ماموستا! ئەو گوتی: مەبەست لە بێسێبەری: بێکەسییە، بێ هاریکاری و، نەبووونی دالدەدەرێك کە لە کاتی پێویستدا لە ژێر سێبەری بحەسێیتەوە..

ماموستا: ئەی ئافەرین یارۆ،

سەد ئافەرین بۆ خۆت و بۆ باپیرەی ژیرو دونیا دیوت.





مامۆستا: زۆر باشە، هەریەکەو بەجۆرێك بیر لە خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان دەکەینەوە.
ئەگەر سەرجەم بۆچوونەکانی خۆمان چڕ بکەینەوەو، ڕێکیان بخەین، ئەوا دەبینین نایابترین شت بۆ مرۆڤ:
دابینبوونی خواستە راست و ڕەواکانییەتی، چارەسەرکردنی کەم و کورتی و گرفتەکانیەتی، خۆشی نەخۆش، چاك
بوونەوەیەتی، ویستی هەژار، دەوڵەمەند بوونە، ئاواتی بەندی، ئازادییە.
بەڵام دوو سێ مەرجی گرنك هەن، ژیر و سەرکەوتووەکان، لە ژیانیاندا ڕەچاوییان کردووە، بە هۆیانەوە لە
تەنگوچەڵەمە دەرباز بوون، خواستەکانیان هاتۆتە دی، شکۆداریش بوون:-
ئەگەر گرفتی ناخۆش، وەك نەخۆشی و هەژاری و کەوتن و.. بکەوێتە پێشیان، وره بەرنادەن
لە ژێر باری خەمدا هیوا بڕاو نابن، لە کۆشش و ماندووبوون و هەڵستانەوە ناترسن.
بە تێکۆشان و نەبەزین بە وردی و ڕەوابینییەوە، هۆکاری سەرنەکەوتن و گلانیان دەدۆزنەوە،
بە متمانەوە، بە ڕێگەی راست و دروست، خۆیان لە دۆخی نالەبارو باری گران و ناخۆشی دەرباز دەکەن،
نەك بە گزی و کاری چرووك و ڕەنجی خەڵك خواردن.
چاکەچێن: شیرینی و ڕێز و خۆشەویستی دەدروێتەوە،
سەربەرزی بۆخۆی دابین دەکات، سوود بە دەوروبەریشی دەگەیەنێت.
چاکەکاران ناوییان بە شکۆداری لە مێژوودا تۆمار دەکرێت، نەوەکانیان شانازییان پێوەدەکەن..
بەد کارانیش خۆیان دەسووتێنن و، دەوروبەریشییان ڕەش و ناشیرین و شەرمەزار دەکەن.



# پلان

دوای نیوەڕۆی ڕۆژێکی سەرەتای مانگی گوڵان، هۆگر تۆپێکی بریسکەداری بەدەستەوە بوو، بەکەیفسازییەوە، بەچووزەڵکێ و لۆکەلۆك، بە خۆهەڵدان و شاپ وەشاندن دەڕۆیشت، جارجارە سەیری تۆپەکەی دەکرد و بەزەوی دادەدایەوە، کە هەڵدەبەزییەوە، ئەو بە دەستی دەیگرتەوە، ناوە ناوەش بەدەم گۆرانی گوتنەوە، تۆپەکەی ڕووەو ئاسمان هەڵدەدا و چەندجارێك بەکەللەی لێیدەدا، ئینجا بەدەستێك دەیقۆستەوە.

بەدەماخەوە لە دەرگەی ماڵی کەوگری هاوڕێی و هاوپۆلی دا.





دوای چاکوچۆنی، بەگەشانەوەیەکی بێ ئەندازەوە گوتی:ـ

کاکە کەوگر! بڕوانە ئەم تۆپە نایابە! ئەمە خاڵۆم لە ئەڵەمانیاوە بۆی هێناوم.

لەیستۆکی زۆر سەیرو ژیکەڵەو ژیریشی بۆ (هۆزار)ی خوشکم هێناوە:

دایك و کچێکی قژ زەرد و چاوشین و گوپن و مۆدەن، بە پیل دەجووڵێن، دەڕۆن، برۆ هەڵدەتەکێنن.

کچۆڵەکە دەگری، دایکی ڕایدەژەند، بەگۆرانی خۆش ژیری دەکاتەوە، ئەوکات هەردووکییان قا قا پێدەکەنن.

هاتووم، من و تۆ و یارۆو گارای هاوپۆلمان بەم تۆپە نوێیە، لەم شەقامە بەرینەی بەردەرگەی ئێوە بەیەکەوە یاری بکەین.

کۆتری خوشکت و نمەخان و گێلاسی خوشکی (گارۆ)ش، بچن لەناو چیمەنی باخەکەمان، لەگەڵ هـۆزار و دایك و کچی چاوشین، سواری جۆللانە بن، چەرەز بکرتێنن، چای بەشیر بخۆنەوە، بە چە پڵەکوتین گۆرانی دایکە چاوشینەکە بڵێنەوە... وەی وەی... لێدە و بخۆ!!

کەوگر، بەشادییەوە تۆپەکەی لەهۆگر وەرگرت، سووڕاندی، تێی ڕاما، بەسەرسامییەوە:-
بەخوا برا تۆپێکی چاکە، هەرچوار هاوڕێش بەیەکەوە تۆپانێی خۆش دەکەین... غەننە یارۆو، شووتی بەهێزی گارای دڵگرن،
(بەهێمنییەوە) زۆر سوپاس کاکە هۆگر! ئێمە هاوپۆل و هاوسێ و هاوسۆزی یەکدین، تۆو خاڵۆت دڵی ئێمەشتان
گەشکردەوە، بەڵام کاتەکەمان کاتی وازی نییە، یاریگە و گۆڕەپانی گونجاو شوێنی یارین، نەك کۆڵان و شەقام، ئێستا
خەریکبووم وانەکەی مامۆستا ڕاوێژم دەنووسییەوە، بەیانی مامۆستا هۆنراوەی ((کار لە کاتی خۆیدا)) مان لێ دەپرسێتەوە،
ئەرکی وتووێژی ئینگلیزی و ئەزموونی جوگرافیاشمان هەیە، کۆتایی ساڵی خوێندن نزیکە، با بە نمرەی بەرز دەربچیین. چ زوو
لەیادت چوو؟! ئەمرۆ مامۆستا ڕاوێژ چەند کەڕەت بایەخی کات و گرنگی پلانی دووپاتکردەوە؟
ئەدی نەیگوت:- ((کاری لەوەختی، پاشای سەرتەختی... کات لەزێڕ بەهادارترە... کاتی بەفیڕۆدراو بێگەلك دەڕوات،
چرکەساتێکیشی ناگیرێتەوە، ناگەڕێتەوە، ناکرێتەوە، وام نا کرێت.کاتی داهاتوو، نەهاتوو و نادیارە، ئەوچرکەیەی تێیدا
دەژین هی خۆتانە، بەخۆڕا بڕوات، بەبێسوود گومی بکەیت، دەدۆڕێی؟.))
ئەدی مامۆستا، بە چوار ڕەنگ، لەسەر دەپە سپییەکە،نەینووسی ((کات و کاری بێ پلان،وەك ڕێژنە بارانی هاوینە))؟ ماناکەیشی
بە درێژی بۆ راڤەکردین.
کاکە هۆگر! باوکیشم ئێوارەی هەینی رابردوو هەمان شتا، گوتی:-
کات بەمفتەدان، کاری بێئامانج و بێ کارنامەی دروست و تۆکمە، پێشێلکردنی کات و کارو بەرنامە، مرۆ بێ سەروبەرو، بێ دەست
و پێ و بێ دەسکەوت سووردەدا، ڕۆژگار تەقڵە بە بێ پلان و سوورتکان لێدەدات.((
کەوگر بە موکرییەوە:- کاکەهۆگر! هەنووکە بە پێی پلان، کاتی نووسینەوەم کۆتایی دێت، دەبێ ئەرکی جوگرافیاو ئینگلیزیش
ئەنجام بدەم، ئەوکات نۆرەی کاری دەرەوەو ماوەی وازیم دادێت، ئێوارەیش سەیری فیلمی سندیبێل، پشیلەو مشك دەکەین.دواتر شێو
خواردن - ((کار لە کاتی خۆیدا)) ئەزبەر دەکەم، ماوەیەکیش گەمە و مەشقی کۆمپیوتەرە، ئینجا بە ئاسوودەیی لە کاتی
دیاریکراودا دەخەوم، بەیانیش لەکاتی خۆیدا هەڵدەستم.
کەوگر بە جەختکردنەوە:- کارنامەی من و کۆتری خوشکم و (نمە) و (یارۆ)ی برای لەیەك دەچن، تێکرای نمرەکانیشمان نایابن،
وێڕای داهاتووی درەوشاوە و ڕێزداری خوێندگە، خۆشەویستی کەس و کارو چاوگەشی گەڕەك و کۆڵانیشین.



هۆگر بە بزێوی و نائارامییەوە:ـ کاکە کەوگر! بە ڕۆژێك چی ڕوودەدات؟ ئێوارە سەیری سندیبێڵ ناکەین، تا درەنگی شەو دەخوێنین، تاکو وانەکان تەواو نەکەین ناخەوین،( بە بێباکییەوە )خۆت دەزانی نمرەکانی من نزمن، لەنیوەیان کەوتووم یا لەسەر لێوارم، کەچی ناشترسم، تۆیش بە نمرەی زۆرباش و زیرەکی خۆتەوە تۆقیوی.



بەمۆنی و مووڕییەوە کەوگر! واز لە دلڕەقی بێنە، وازییەکەمان تێك مەدە!
و بە نیگەرانی نیمچە زوێرییەوە دڵمان مەشکێنە،
نرخی وەرزش و ڕێزی دۆستایەتیمان مەسووتێنە!...
بە ڕوو شکێنییەوە نەوێرۆك! تۆ لە مامۆستا و لەماڵەوە دەترسی!
بێی ئەوان ناکارێی ئاویش بخۆیتەوە، بانگی کۆتر بکە، ئەو لە تۆ ئازاترە،
پێی بڵێ!... نا... نا.. خۆم بە کۆتری لە کەوگر پیاوتر دەڵێم.
کەوگر:ـ هۆگر گیان ! گوتم ئێمە پەیوەستی پلانی کارو کاتی دیاریکراوین،
بەڵێن و کارنامە شکێن نین، وەك دایکم گوتی: دەبێت داهاتوو ببەینەوە،
نەك گەمە ببەینەوە و دوارۆژ بدۆڕێنین
بۆ دڵنیایی و ڕێزلێنان و پێزانینیشت بانگی کۆتر دەکەم.
سێ چوار هەنگاو بەرەو دەرگای ژوورەوە گەڕایەوە، بەدەنگێکی نەختێك بەرز:ـ کۆتر!.. کۆترخان...!
هۆگر بە دوای کەوگر داچوو، کە کۆتر دەرگای کردەوە، هۆگر سێ هەنگاو وەپێش کەوگر کەوتبوو،
بەبزەوە، تۆپەکەی پیشاندا، ویستی ڕاسپاردەکەی هۆزار و مژدەی بووکەلە سەیرەکەیشی بەکۆتر بڵێت
کەوگر:ـ کۆتر! هۆگر هاتووە بانگمان دەکات، من لەگەڵ ئەو و هاوڕێیا نمان تۆپانێ و تۆ و هۆزار و دەستەخوشکانتان بە بووکە شووشەیەکی نوێ و سەیر یاری بکەین.
کۆتر:ـ سوپاسیان دەکەین، بەڵام ئێمە بە پێی پلان هەر کارەو لەکاتی خۆیدا دەکەین. ئەدی کاتژمێرێك لەمەوبەر نەتگوت ئەمڕۆ مامۆستا ڕاوێژیش وەك باوکم گوتی:ـ کات بەنرخە خۆڕا مەیفەوتێنن، هۆگری هاوپۆلت نەیبیست؟ تۆ پلان و کاتنامەی خۆمانی پێبڵێ!

ئەگەر بەرنامەکانیان وەك کـــارنامەی ( نمە ) و ( یارۆ )لەگەڵ ئەوەی ئێمە گونجا، خۆشیان ڕێکوپێك و لەباربوون، ئەوا هەرکاتێك بواری یاری هاوبەشمان هەبوو، دۆستانە یەکدی پێکدەکەین و بەیەکەوە...
ڕێزو سڵاوم بە هۆزارخان رابگەیەنە. کۆتر کشایەوە، دەرگاکەی بەڕوویاندا داخست.
هۆگر بە دڵی بەردین و بێنی تەنگ و دەروونی پڕکینەوە، چووە دەرەوە، ماوەیەك تەزی. دواتر هەڵچوو... بە گومان و نابەدڵییەوە، بەرەو ماڵی ( یارۆ ) هەنگاوی گرانی نا، بەئەسپایی لەدەرگەی دا.
نمەی خوشکی ( یارۆ )ش هەمان ڕەفتار و گفتاری کۆتری دووبارە کردەوە.
هۆگر بە پەستییەوە ماوەیەك داما، پیشی خواردەوە، تەزی.
لەناکاو ڕەنگ و رووی هۆگر گۆڕا، گەشایەوە، بەشادییەوە :ـ
ئێستا دۆزیمەوە! ... ئێ ئێ... هەنووکە زانیم...
بۆ ئەوان پلە بەرز و پێشەنگ و لەبەر دڵانن!
ئەوان پلانیان هەیە و کات نادۆڕێنن...
ئێمەیش گەمە بە پلان و بە کات دەکەین.
لەبەر خۆیەوە چیمان لەوان کەمترە؟
مەرج بێت لەمڕۆوە، هەرلەم خولەکەوە، لا، لە هەڵەی ڕابردوومان بکەینەوەو، پەندی لێ وەربگرین، بە باوەڕی پتەو و ڕاکردنی پڕ تەوژم و کۆڵنەدانەوە.
بە پلان و بە کارنامەی سات و ڕۆژ و ساڵانە، بە کردارو رەفتاری شیاو لە کات و شوێنی خۆیدا، بە پێش پێشەنگەکانیان بکەوینەوە.



# کێ بە هێزترە

ڕێگر کوڕێکی تەمبەڵ و هارو هاجە، پۆلی شەشەمی سەرەتاییە، ناوی لەخۆی ناوە دەرباز، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی هاوشێوەی چوار وەرزەی ساڵ لە گەڕەکەکانی دەورروبەریان، میوەی باخچەی ماڵان، بە یەنگی دونیاو ترێ و، پرتەقاڵەوە، بە هەرمێ، هە نجیر، هەنارەوە دەچنیەوە و دەیان خوارد و خۆیشیان پێهەڵدەکێشا، زامدارو ڕێبوار هاو پۆل و هاوڕێی بڵحی ئەو بوون.



ڕۆژێکیان دەرباز پلان دادەنێ کە چۆن لەڕێگەی گەڕانەوەیان، لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵ، پرتەقاڵی دارە بەرزەکانی باخچەی تەلارێك بڕنن، بە درێژایی ڕێگەکە تا گەیشتنە بەردەم دیواری باخی ماڵەکە،
هەر بیریان لە چۆنیەتی چنینەوەی پرتەقاڵەکان دەکردەوە.



که گەیشتنە شوێنی مەبەست، دەرباز دەستی بە دیواری باخەکەوە گرت و نەختێك دانەوییەوە و گوتی: رێبوار! تۆ سەرکەوە سەر پشتم! بچۆ بان شانم، دەستت دەگاتە پرتەقاڵە زەردو گەورەکان، لێیان بکەوەو بۆ زامداریان بهاوێژە، ئەویش ئازایانە دەیانگرێتەوە.

رێبوار دوو پرتەقاڵی لێکردەوە، سێیەمیان گەورە و زەردو دڵگرتر بوو، بەڵام شوێنەکەی بەرزو ئاستەنگ و ترسناکتربوو، دەستی نەگەیشتێ، خۆی پتر هەڵکێشاو لاربۆوە، بەلاداهات و لە سەرەوەڕا کەوتە خوارەوە، باسکی راستەی گردەبڕ شکا.

ڕێبوار بەگریان گەڕایەوە ماڵەوە، دەربازو زامداریش بوونە گەواهیدەر: گوایە لەیاری تۆپی پێ بەربۆتەوە، ڕێبوار دەگەیەننە نەخۆشخانە، دەست و باسکی لە گەچ دەگرن.

جاری دواتر زامدار دەچێتە سەر پشتی دەرباز، چەند لیمۆ و لالەنگییەك لێدەکاتەوە، کاوانی خاوەن ماڵ ، خەریك بوو دەهاتە ناو باخەکەیان، زامدار ویستی پیاوەکە نەیبینێ، بە پەلە دابەزی، لە کاتی سەر نویکردندا ، تەلدڕکی پەرژینەکە و دڕکی دار لیمۆ، کوڵمییان دڕی، چاوی چەپیشی بریندار بوو.

هاوەڵەکانی، زامداریان گەیاندە ماڵەوە و گوتیان: چەند قوتابییەکی شەڕانگێز لەیەکدیان دەدا، ئەویش چۆتە نێوانیان و، نووکە پڕگالی بەرکەوتووە.

باوکی بردیە لای نوشدار، بە حەوت تەقەڵ برینەکەیان بۆ دروووەوە و تیماریانکرد.

کەجارێکی تر هەمان کار دەکەنەوە، بۆ یەکە مجار هزردار لەگەڵ خۆیان دەبەن و دەیکەنە پاسەوان و هۆشیارکاری سەری کۆڵانەکە، ساکاریش ئاوای ناو باخی ماڵێکی کڕوکپ دەکەن، ساکار شێتانە پرتەقاڵەکانی لێدەکردەوە و بۆیانی هەڵدەدا، ئەوانیش دەیانقۆستەوە.

لەم کاتەدا هزردار هاواری کرد: هاتن... کوڕینە هاتن... ئاگاداربن... هەڵێن... هاتن... هاااااتن...

هزردار بەترسەوە هەڕایکرد، کە بە پەشۆکاوی شەقامەکەی دەبڕی، خەریك بوو بکەوێتە ژێر ترومبێلێکەوە، لەگەل سووڕاندا لە پا و لەپ کەوت، بە پەلەتر هەڵستایەوە و قوچاندی.





لەملایشەوە ( مامۆستا هۆشیار ) ی خاوەن ماڵ گەیشتە سەر سەری ساکار، لەپشتەوەرا ملی گرت.
ساکار بە لەرزو هاوارەوە کەوتە پاڕانەوە و خۆ پچڕینەوە.
مامۆستا هۆشیار: هەژی... هەژی کوڕم... دەرگاکە بکەوە! بزانە هاوکارانی ئەم پاڵەوانە کێن؟ گەرەکیان هەراسان کردووە، تەنیا هەوڵی ناسینی ڕوخسارییان بدە، مەکەوە شوێنییان!
ساکار بە زەرد هەڵگەڕاوی: بەخوا گەورەم...
ئەم کارە دەرباز پێی کردم، ئەمە یەکەم جارمە.
ئەمە پلانی ئەو بوو، بۆخۆیشی دەرباز بوو.
مامۆستا بڕێکی دیکەش میوەی باخەکەی خۆیانی ڕنی و دایە دەست ساکار.
ئینجا دەستی ساکاری گرت و بەرەو دەرگەی ماڵی (کاك سەرباز)ی دراوسێیانی برد.
لە دەرگایدا، کوڕەکەش دەیزیڕاندو خۆی رادەتەکاند، دەپاڕایەوە، بە تۆبەکردنەوە داوای لێبووردنی دەکرد.
کاك سەرباز: بە حە پەساوییەوە: مامۆسستا! مامۆستا وشیار! ئەمە چیە؟
مامۆستا: هاتووم سواڵ بۆ ئەم منداڵە بکەم، کە ناتوانێ بەسەر ویست و ئارەزووە دزێوەکانی زاڵ بێت، بۆ سکی گەنیوی خۆی دەخاتە مە نجەڵەوە، شەرمەو گزیکاری لە پێناوی ویستی ورگی دەکات، لەبری ئەو دزی بکات، من دەرۆزەی بۆدەکەم، ( بە پاڕنەوە و دەستپانکردنەوە ) بە خێری خۆتان پرتەقاڵێك، هەناریکم بدەنێ
کاك سەرباز: ئەمانەن میوەی دارەکا نمان دەڕنن؟! لە دەست ئەمانەوە تا ئێستا بەری دارەکانی خۆمانم نەناوەتە دەممەوە ... با سزایەکی چاکی بدەین، ئینجا بیبەینەوە لای باوکی
ساکار: بە گریانەوە، مامۆستا، بە خوداو بە پێغەمبەر باوکم نەماوە. دەرباز تووشی کردم ئەمە یەکەم جارمە، دواجاریشم دەبێت...

ماموستا هۆشیار: نا...نا... لێرەوە سزای نادەین، نایشی بەینەوە ماڵەوە، چونکە دەبێتە گاڵتەجاڕی منداڵانی گەڕەك، شەرمەزاری دەکەین، لە ماڵەوەش سزای نالەباری دەدەن،.

سەرباز:... بابزانین ناوی چییە و کوڕی کێیەو ماڵیان لە کوێیە؟

ماموستا: لەمەیشدا راستی نابێژیت، نابێ بڕوای پێبکەین، پتر فێرە درۆو کەمباوەڕیشی دەکەین.

ساکار، بەچاو و دەم و بە هەمووگیانی دەپاڕایەوە، چاوەڕوانی بڕیاری چارەڕەشی خۆی بوو.

سەرباز: با بیبەینە بنکەی پۆلیس.

ماموستا: ئەمەشیان لەگەڵ منداڵدا ناکرێت، وێنەی کردارە بەدەکانی لە گۆڤار و رۆژنامە و ڕاگەیاندن و هەواڵەکان بڵاودەکەنەوە، بە یەکجاری ئابڕوی دەچێت ئیتر ناگەڕێتەوە سەر راستەڕێ...!

ساکار: ماموستا! سوێند بە خودای ڕاگری زەوی و ئاسمان، بە قورئانی پیرۆز، بە پێغەمبەری خودا، بە گۆڕی باوکم ، دەرباز فێریکردم ، ئیدی تۆبە و هەزار تۆبە (بە گریان و نووزانەوە) براگەورەکەم بزانێت سەرم دەبڕێت...

سەرباز: لە سوێندخواردن و پارانەوەو نواندن چەند شارەزاو رەوانە.

ماموستا: بەدکاران چەند جارێك بە سلی و وشیارییەوە دەرباز دەبن، بەڵام ساکاران لە سادەیی خۆیانەوە، زوو بە داوە وە دەبن و، سزای تاوانی ئەوانیش دەچێژن، کاکە سەرباز گزیکار هەرچەندە وریاو جەربەزەش بێت، درەنگ و زوو ،بە هەردوو پێیەوە بەتەڵەوە دەبێت، کە ئیدی دەرفەتی دەربازبوونی نامێنێت.

ئەوانەی کە سوێندی گەورە گەورە دەخۆن، پتر گوتەکانیان گومانی ناراستی لێدەکرێت، راستگۆ و راستکار پێویستیان بە سوێند و پاڕانەوە نییە، هەر بەخۆم چەند پرسیارێکی لێدەکەم، بەڵام وەڵامی راست و دروستم دەوێت، ئەگینا خۆم دەزانم چی دەکەم.

پرسیار: مرۆڤی پاڵەوان کەسێکە دەرەقەتی خەڵکی بێت، یا دەرووەستی خودو نەوسی خۆی بێت؟

دەرۆزە شورەیی ترە، یا فراندن و دزی و گزیکاری؟ ئەوەی بە درۆ نێوچەوانی خۆی رەشبکات، بەچی سپی دەکاتەوە؟

ساکار: بە دەم هەنسکدانەوە: پەندم وەرگرت، ئەمجارەیان بمبوورن ،ئیدی کاری وا دووبارە ناکەمەوە، بەقسەی هاوڕێی بەد هەڵناخەڵەتێمەوە.

کە هزردار گەڕایەوە ماڵ، بینی باوکی سێو و پرتەقاڵی کڕیبوو، زۆر پەشیمان بووەوە، بەشەکەی خۆی هەڵگرت، بەیانی لە ڕێگای قوتابخانەوە، دوو پرتەقاڵی فرەدایەوە ناو هەمان باخەوە، بڕیاریشیدا جارێکیدی نزیك هاوڕێی نارەسەن نەکەوێتەوە، بە گەندەکاری، خۆی دوچاری سەرشۆڕی و سزا نەکاتەوە.

دوای چەندین ساڵ بیستیانەوە، کەوا رێگر (دەرباز) و هاوەڵ دزێکی، بە تاریکە شەوێکی ساردو سەرما، بە نیازی دزینی زێرو دراو، چوونەتە سەر ماڵی دەوڵەمەنێکی دوژمندار، لەو چرکە ساتەی کە رێگر ئاوا دەبێتە ناو حەوشەکەیان، هاوەڵەکەشی لەسەر دیوار خەریکی چوونە ناوەوەیە، پاسەوانی ماڵەکە لە پەنای ستوونی ئەستووری هەیوانی خوارەوە چرا دادەگیرسێنێت و دەنگی دەدات:

کابرا کێی؟ ئەگەر دوژمن نیت؟ خۆت بناسێنە دەنا دەتکوژین! هاوەڵەکەی دەگەڕێتەوە.

کە رێگر لە رووناکییەکەدا دەرفەتی سەرکەوتن و ئاودیو بوونەوەی نامێنێت، خۆی دەخاتە پەنا سێبەری تەنکییەکی نزیکی، هاوار دەکاتە هاوەڵەکەی: بیانکوژە! تەقەیان لێبکە! دەنا دەربازنابم.

لە ژوورەوە تولەسەگێکی دری تێبەر دەدەن، تولە دەگاتە سەری و بارانگژی دەبێت و دەیەوێت قەپ لە ناو گەلی بگرێت.

رێگر بە دەست و پێ دەروەستی سەگەکە نایەت، لە ترسانا بە دەمانچە لێی دەدات.

هاوەلی دزە لەودیوی دیوارەکەوە، تەقە لە پاسەوانی پشت ئەستووندنەکە دەکات.

توولە دەقرووسکێنێت. پاسەوانی نهۆمی بانەوەیش رووی تفەنگەکەی دەکاتە رێگر و بە دەنگی بەرز دەڵێت: خۆت بدە بە دەستەوە ئەگینا کوژرای.

هاوەڵدز بۆ کوشتنی پاسەوانی بانەوە، رستەیەك گوللە لە بەر پە نجەرەی بانی نهۆمی دووەم دەدات.

پاسەوان بەرناکەوێت دەبێتە تەقەو لێکدان، گوللەیەکی ئاگردار بەر تانکییەکە دەکەوێت.

تومەز تەنکییەکە نەوتی تێدا دەبێت، ئاگر دەگرێت و مەشخەڵ هەڵدەوستێت.

رێگر ئاگری گرتووە و بە دەستی بە دەمانچەوە رووەو ئەستووندەکە دەچێت.

داوا دەکات بیکوژێننەوە.

لە پەنای ئەستووندەکەوە بە تووڕەیی پێی دەڵێن: دەمانچەکەت فرێدە! ئەگینا بە گوللەیش ئاگرت تێبەردەدەین!





دەمانچەکەی تێهەڵدەدات و دەکەوێتە کوژاندنەوەی بڵێسەی ئاگری گیانی، دەکەوێت، بە ئاگرەوە دەگەوزێت و بە دەم سووتانەوە گینگڵدەدات.

پاسەوانێکی بانەوە تڤەنگی لەسەر دزە رادەگرێت و دەڵێتە ئەونەی خوارەوە: بیکوژێننەوە با نەمرێت.

پاسەوانێکی دیکەش لە کۆشکەکەوە سەیری کۆڵانی دەستە راستیان دەکات، دەبێنێت: هاوەڵدزەکە بەبەر گلۆپی ماڵێکی دەرگا نیوە کراوەوە رادەکات و دەکەوێتە پەناوە، پاشدزەکەیش خۆی دەکوتێتە دەرگە کراوەکەوە.

دوو پیاو، بە مەبەستی کوژاندنەوە، لێفەیەکی تەڕ لە ڕێگر لوولدەدەن. کە ئاگرەکە کوژایەوە بینییان: سەرو سەکوت و دەست و پێی ڕێگر وەها سووتاوە، نەك دایکیی ناینناسێتەوە، بەڵکو بیبینێت لێیشی دەترسسیت.

لەم کاتەدا ویقەویق و، ڕووناکی سوور، کۆڵان و دەوروبەرەکەی پڕکرد، ترومبێلی ئاگر کوژاندنەوە پۆلیسی فریاکەوتن گەیشتن، دوو پۆلیس لەگەڵ ڕێگری سووتاو بەرەو نەخۆشخانەی فریاکەوتن بە ویقە ویق و بە پەلە کەوتنە ڕێ

پاسەوانێکیش دوای کوژاندنەوەی ئاگرەکە بە دیار هێسك و پروسکی سووتاوی تولەکە فرمێسکی ڕشت چەند پۆلیسێکیش پاشدزەکەیان بە دەست بەستراوی لە ماڵەکە هێنایە دەرەوە.

کە مامۆستا دەنگوباسەکەی بیست، گوتیە کاك سەربازی هاوسێیان: گوتم ئارامت هەبێت؛ ئێستا بۆت دەرکەوت کە وانەی پەندی ڕۆژگار، گەلێك بە سوودترە لە سزاو ترس و ئازار.




چاکە چین


کەڵە شێر کاتژمێرە


دارکونکەرە


کێ بەهێزترە


خۆشکی خۆشاوی
دەوێ


پلان




# پلان

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

نووسینی: سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر

نیگار: گرفتار کاکەیی